# تەڵای دەستەوشار

یا

مێژووی بوژانی بەوشار

نووسراوی :

صدیق بۆرەکەیی (صفی زادە)



# تەڵای دەستەوشار

یا

## مێژووی بوێژانی ئەوشار

نووسراوی :

صدیق بۆرەکەیی ( صفی زادە )




طلای دست افشار

ویراسته : صدیق صفی زاده ( بورەگەیی)

چاپ اول : بهار ۱۳۶۹

چاپخانه : حیدری

تیراژ : سەهزار جلد

# ناوەڕۆک


| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| پێشەکی | ٢ |
| کورد لە بەرەبەیانی مێژوودا | ٣ |
| ناوچەی هەوشار | ٤ |
| وێژە و زمانی کوردی | ٦ |
| زاراوەکانی کوردی | ٩ |
| هۆنراوی کوردی | ١٣ |
| شێخ شەهابەددینی سوورەبەردی | ٢٥ |
| مەلا ئەحمەدی عارف | ٣٠ |
| سەی حەمەساد‌قی سەفاخانەیی | ٣٤ |
| میرزاعەبدوڵڵای خەیاڵی | ٣٩ |
| خەلیفە ئەڵماسی گەزەردەرەیی | ٤٢ |
| نەجەف خانی یاپندوڕ | ٤٦ |
| مەلا ئەبووبەکری یووسف | ٥٠ |
| مەلا فەرەجی بۆرەکەیی | ٥٤ |
| میرزا موحەممەدی هەوشاری | ٥٧ |
| جەوادخانی گەڕووسی | ٦٣ |
| بابەجانی بۆرەکەیی | ٦٦ |
| میرزا حەسەن عەلی غەریب | ٧٠ |
| حەیدەر بەگی بەرازی | ٧٥ |
| سەرچاوەکان | ٨٢ |

# پێشەکی

له مێژەوەحەزلە خوێندنی پەڕتووک و نامیلکە و وتاری وێژەیی ئەکەم و کاتی خۆم بە خوێندنەوەی ئەم چەشنە پەڕاوانەوە ئەبەمە سەر . ماوەیێکە کە وێژە و فەرهەنگی گەلەکەمم ناسیوەو بۆم دەرکەوتووە کە لە ناو گەلی کوردا گەلێ هۆنەرو زاناو وێژەوان و پیتۆڵ هەڵکەوتوون وە لەبەر ئەوەی بە نوسراوەکانیان بایەخێک نەدراوە ، شوێنەوارەکانیان لەگەڵ خۆیانا تیاچوون و نەماونەتەوە ، ئەوەش کە ماێتەوە ئەوەندە بایەخی پێ نەدراوە .

ماوەیێک لەمەوپێش بەسەرهات و هۆنراوی چەند هۆنەرو بوێژی هەوشاری و گەڕووسیم کەوتە دەست و بە کەڵکم زانی کە سەرگوروشتەو هەڵبەستەکانیان لە پەڕاوێک دا بە توانجی خۆم بنووسم و پێشکەشی کەمە خوێندەوارانی بەڕێزو هێژای کورد کە هیوادارم لە کەموکووڕی چاوبپۆشن و لێم ببوورن ، چونکە هەر ئەوەم لە وزەدا بووەو ئەوەم بۆ کراوە .

صدێق بۆرەکەیی ( صفی زادە )

تیکانتەپەی هەوشار ـ مانگی جۆزەردان ١٣٤٦ی هەتاوی

# كورد لە بەرەبەیانی مێژوودا

کورد کە یەکێ لە نەتەوەکانی ئێرانی یە، بزووتنەوەی ئە-
گەڕێتەوە بۆ ماوەی سێ هەزارو پێنجسەد ساڵ پێش زایین، وە لە
سەرەتای ئەم مێژووەدا بە ڕەوشتی کۆچەرایەتی لە سەر شاخەکانی
زاگرۆسدا بە ناوەکانی : " گووتی ، لۆلۆ، کاسی،نایری،میتانی
ئۆرارتوو ، کوردۆک " ژیاون و پاشان وڵاتی مادیان دامەزراندووە
و تا ساڵی ٥٥٠ ی زایین بە سەر سەرانسەری ئێرانا فەرمانڕەو-
وایی یان کردووە.

مامۆستا سایس لەم بارەوە ئەڵێ: مادەکان ئەو عێلە
کوردانە بوون کە لە خۆرهەڵاتی وڵاتی ئاشووردا ئەژیان و کەو-
شەنی خاکەکەیان تا باشووری زەریای قەزوێن ئەڕۆیشت .مادە
کان کە لە بنەڕەتا ئاری بوون زمانیشیان لکێک بووەلە هیندو
ئۆروپایی، وە زۆربەی خۆرهەڵات ناسەکان و مێژوونووسان لە سەر
ئەو بڕوایەن کە زمانی مادی دایکی زمانی کوردییە ،" سیرۆلسن"
یش ئەڵێ : کوردەکان ئەگەڕێنەوە سەر نەتەوەی ماد وسەرچاوەی
زمانی کوردی، زمانی مادی یە .

ئیسترابۆن جوغرافی زانی بەناوبانگی یوونانی کە لە
زەمانی ئەشکانی یەکان دا ژیاوە لە نووسراوەکەی دا دەوڵەتی
مادی کردووەتە دوو بەشەوە: مادی گەورەو مادی بچوک یا مادی
ئاترۆپاتی. پاشان ئەڵێ : مادی گەورەکە پایتەختەکەی شاری
ئەکباتان " هەمەدان"ە شارێکی زۆر گەورەیەو پادشاکانی مادلەم
شارەدا گەلێ کۆشکی گەورەیان هەبووە . بەشی دووهەم مادی بچوک
یا مادی ئاترۆپاتی یە کە بەشێک بووە لە خاکی مادی گەورەو،وڵاتی

مادی ئاترۆپاتی لە لایەن خۆرئاواوە لەگەڵ ئەرمەنستان و ماتیان وە لە لایەن خۆرهەڵاتەوە لەگەڵ مادی گەورە، وە لە لایەن باکوورەوە لەگەڵ دەریای هیرکانی دا هاوسنوورە. پایتەختی مادی ئاترۆپات شاری "شیز" بووە کە ئێستا تەختی سلێمانی پێ ئەڵێن و لە سی کیلۆمەتری تیکانتەپەی هەوشاردایە.

بەپێی وتەی ئاپۆلۆنیدس، وڵاتی مادی ئاترۆپاتی سپایێکی بەهێزو گەورەی هەبووە، وە لە هەر دەمێکا ئەیتوانی دە هەزار سوارو چل هەزار پیادە بنێرێتە مەیدانی شەڕەوە. لە کوێستانە سەختەکانی ئاترۆپاتی دا هەندێ عێل و خێڵ و هۆز بە ناوانی: "کاردووسی، ئەمەرد، تاپوور، کورتی" یەوە ئەژیان کەخەریکی رێگریو جەردەیی بوون.

**ناوچەی هەوشار:**

هەوشار ناوی ناوچەیێکی کوردنشینە کە کەوتووەتە نێوانی سایین قەڵاو هەوەتووو بیجارەوە. ئەم ناوچە کەزۆربەی دانیشتوانی کوردە، لە بنەڕەتا بەشێک بووە لە خاکی کوردستان وداگری حەفتاو هەشت دێی گەورەو بوچکە. ناوەندی ئەم ناوچە شارێکە بە ناوی تیکانتەپەی هەوشار کە لە سی کیلۆمەتری ئەم شارەدا لە نزیکی دێیێک بە ناوی تازئاوا شوێنەوارێکی کۆن ئەکەوێتە بەر چاو کە بە ناوی تەختی سلێمان بەناوبانگە. ئەم شوێنەوارە کە شوێنەواری مادەکانی ئاترۆپاتی یە، لە مێژووەکان دا "شیز" ناوبراوە. ئیبنی موهلهل کە لە سەدەی چوارەمی کۆچی دا ژیاوەلە گەشتنامەکەی دا باسی شیزی کردووەو ئەڵێ: شیز شارێکە کە کەوتووەتە نێوانی مەراغەو زەنگان و شارەزوورو دەینەوەرەوە. لە کێوەکانی ئەم ناوچەدا زێڕو جیوەو سوروو زێو بەزۆری پەیدا

ئەبێ . لە ناوەندی ئەم شارەدا دەریاچەیێک هەیە بنی نادیارە کە ئەگەر خاکێ لەگەڵ ئاوەکەیا ئاوێتە بێ خێرا ئەبێتەبەرد .- هەروا ئاگرگایێکیش بە ناوی ئاگرگای ئازەر گوشەسپ لەو شوێنەدایە . " حمداللە مستوفی" یش کە لە ساڵی ٧٥٠ ی کۆچی دا مردووە لە پەڕاوی " نزهةالقلوب "دا لە بارەی ناوچەوشوێنەواری شیز کە یادگاری مادەکانی ئاترۆپاتە دواوە . لەپەڕاوی " انجمن آرای ناصری" دا هاتووە : زێدی زەڕدەشت لەشارێ بووە کە کەوتووەتە نێوانی مەراغەو زەنگان ، وە ئەو شارەش شیزە . مارکوارت ئەڵێ : شیز هەوارگەو پایتەختی پاتشایێ مادەکانی ئاترۆپاتی بووە . ئەم ناوچە لەسەردەمی هافی " عمربن الخطاب " دا بە هۆی " مغیرة بن الشعبه "وە گیراوەو زۆربەی خەڵکەکەی بووەتە موسڵمان و هەندێکیشیان کە ئاگرگای ئازەرگوشەسپیان پارازتووە هەر لە سەر ئایینی زەڕدەشتی ماونەوتەوە و ساڵێ هەشتصەد هەزار درهەمیان باج داوەتە فەرمانڕەوای ئەو شوێنە تا لەسەر ئایینەکەیخۆیان بمێننەوە .

لە سەردەمی مەغووڵەکانیشا ئەم شوێنە وەکوو شوێنەکانی- تری ئێران گیراوەو کوردەکانیش لە بەرامبەری مەغووڵەکانا راوەستاون و شێرانە بۆ پارازتنی مەڵبەندەکەیان بەشەڕ هاتوون بە جۆرێ کە مەغووڵەکان وەڕەز بوون و گەلێکیان لێ کوژراوە .

هەوشار هەرێمێکی کوێستانی یەو پڕ لە شاخ و چیاو تاڤگەو کانیو چەمو دارستانە ، لەگەڵ ئەمانەشا لەوەڕگاو دەشتو زەوی و زاری زۆرەو بەم هۆیەوە هەموو شوێنێکی سەوزو ئاوەدان و پڕ لە ڕان و پەزە . خەڵکەکەی گەرچی ژیانێکی سادەو ساویلکەیان هەیە ، بەڵام تا حەزکەی حەز لە راووشکار ئەکەن ، وەلەگەڵ ئەوەشا

گەلێ بابەخ ئەدەنە زانیاری و وێژەی کوردی و بەم بۆنەوە گەلێ هۆنەرو بوێژیان لێ هەڵکەوتووە کە بە زمانی کوردی هۆنراوییان هۆنیوەتەوەو بە یادگار بۆ گەلەکەیان بەجێ یان هێشتووە کەلەم پەڕاوەدا باسیان لێوە کراوە. خەڵکی ئەم ناوچە بە زاراوەی کەلهوڕی ئەدون و لە هەندێ دێ و شوێنیشیا بە زاراوەی کرمانجی باکووری وتوویژ ئەکەن. لەم ناوچەدا گەلێ تورکیش هەن کە بە زمانی تورکی ئەدون، ئەم تورکانە زۆربەیان لەتیکانتەپە دا نو لە شارەکانی جۆر بەجۆری ئازەربایجانەوە هاتوون.

## وێژەو زمانی کوردی

نەتەوەی کورد لە لایەن وێژەو زانیاری یەوە دەوڵەمەندەو گەلێ نوسراوو نامیلکەی وێژەیی و زانیاری و پیتۆڵی بە کەلەپوور بۆ ماوەتەوە. لە پێش ئیسلام دا زۆربەی پەڕتووکەکان بە زمانی پەهلەوی کۆن نووسراوە. ئەم زمانە بە پێی بەڵگەکانی مێژوویی کوردی یەو لە ئێرانی کۆن دا باو بووە. ئەو پەڕتووکانەی کەبە کوردی نووسراون ئەکرێن بە دوو بەشەوە : بەشێکی ئاینی بوون و لەبارەی ئایینی زەردەشتی یەوەیەو ئەو بەشەکەی تریش لەبارەی رامیاری و خوو رەوشت و زانیاری و وێژەیی و مێژوویی وئەفسانەو چیرۆک و دەوڵەتداری و ئەستێرەناسی و پیتۆڵی و دارو درەخت و کشت و کاڵەوە بوون. ناوی هەندێک لە پەڕاوە کۆنەکانی پێش ئیسلام ئەمانەیە : " ئاوێستا ، دینکەرد ، بوندهشن ، کارنامەی ئەردەشێری بابەکان، خوسرەو گواتان ،وشترەنگنامە، وەیس و رامین گەرشاسپنامە، هەزار ئەفسانە"و صەدان پەڕاوی تر.

لە سەردەمی پەیدا بوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بەتایبەت

لە سەدەی دووهەمی کۆچی دا زانایان و نووسەرانی کورد دەستیان دایە پێنووس و گەلێ شوێنەواری گرنگ و بایی داریان دانا و بە یادگار بۆمانیان بەجێ هێشت . ئەم نووسراوانە کە ئێستا زۆربەیان لە بەردەست دایەو زۆربەیان بە هەڵبەست بە زاراوەی ـ گۆرانی وتراون و یادگاری سەدەی دووهەم تا سەدەی سێنزەهەمی کۆچین بریتین لە : " دەورەی بالوول ، دەورەی بابە سەرهەنگ دەورەی شاخوەشین ، دەورەی بابە نااووس ، دەورەی چل تەن،دەورەی گلێم وە کۆڵ، دەورەی دامیار ، دەورەی عابدین، دورەی پیر ـ عالی ، دەورەی بابە جەلیل ، دەفتەری پردیورە ، دفتەری ساوا ، دەفتەری دیوان گەورە ، بارگە بارگە ، سەرئەنجام ، وردەسەرئەنجام زوڵاڵ زوڵاڵ ، کەلامی شێخ ئەمیر ، کەلامی شێخ تەیموور ، کەلامی ـ نەورۆز ، کەلامی حەیدەری، کەلامی عێل بەگی، کەلامی دەروێش قولی، جلوە ، مەسحەفا رەش " و دەیان پەڕاوی تر .

لەبەر ئەوەی زمانی پەهلەوی کۆن تێ گەیشتنی بۆ خەڵک گەلێ دژوارو سەخت بووە ، ئەوە بوو کە هۆنەران و بوێژانی کورد کەوتنە وەرگێڕانی ئەو پەڕتووکانە بۆ سەر زمانی کوردیکە: لە سەردەمی خۆیانا باو بووە . ئەو پەڕتووکانە کە لە پەهلەوی و فارسی یەوە تەرجەمەکراونەتە سەر زمانی کوردی بریتیین لە : " شانامە ، شیرین و خەسرەو ، خەسرەوو شیرین ، باراموو گوڵەندام، حەوتخوانی رۆستەم ، رۆستەم و زۆراب ، جیهانگیرو رۆستەم، برزوو فلامەرز، بەبری بەیان، بێژەن و مەنیژە ، رۆستەمو زەردە هەنگ " و دەیان پەڕتووکی تر .

پاشان هەندێ تر لە هۆنەرانی کورد گەلێ چیرۆک و پەڕاوی تریان بە هۆنراو هۆندەوەو بە یادگار بۆ گەلەکەیان بەجێ یان

هێشت کە ناوی هەندێ لەو پەڕاوانە ئەمەیە: " مەم و زین ، ـ نادرنامە ، خورشیدو خاوەر ، کەنیزەک و یازدە رەزم، شەماڵ و ـ زەلان ، لەیلاو مەجنوون ، بەرگ و گوڵ ، درەختنامە ، قارەمان و قەیتەران ، کوردو گۆران ، شیرین و شەفێ ، مزگت و میرزا ،ئاسمان و زەوی ، حەیدەرو صنەوبەر ، بەنەوش و بەڕەزا ، یووسف و زلێخا ، شێخ صەنعان ، نازو نیاز" و دەیان پەڕتووکی تر .

لە وێژەی کوردی دا هەندێ شوێنەواری بەنرخ و بایی داربە جێ ماوە کە بەناوی " بەیت ناسراوە . ئەم بەیتانە کە دانەرەـ کەیان ناوێکیان لە خۆیانەوە بەجێ نەهێشتووەو خەڵک دەم بە دەم ئەیگێڕنەوە . ئەم بەیتانە کە بە هۆنراوو پەخشان نووسراون مێژینەیێکی کۆنیان هەیەو گەلێ رووداوی مێژوویی و مەبەستی کۆمەڵایەتی کوردەواریمان بۆ ئەگێڕنەوە . ئەم بەیتانە زۆرن و ناوی هەندێکیان بەم چەشنەیە :" ئاسکۆڵە ، ئاگری ، ئەوسانە ، بابکۆ ، باپیرە ، بازاری، باوانم، بارام و گوڵەندام، بەهارە ، بوڵبوڵ ، برایمۆک ، بوهاری کوردی، بوزبەگ ، شێرکۆ ، خەج وـ سیامەند ، دمدم، دوانزە سوارەی مەریوان ، فەرهادو شیرین ، فرشتە ،گۆران ، گەڵباغی، گەلۆ ، گوڵان گوڵان، گۆرانی، گۆرانشا ، گوڵنازو کەلاش ، هاوینە ،هەسپی ڕەش ، هەورامانی، کاکە سوار ، کورمانجی ، کەڵ و ئەسپ ، کەویار ،کوردستان ، لاس و کەزاڵ، لەـ شکری، لوڕو سوران ، مەمو زین ، مەمی ئالان ، میری موکریان نیوەشەو ، پاییزە ، پیرۆزە ، رەشە راو ، رۆڵەی نەبەز ، سمکۆ، سوارە شاریار ، شابازی موکری، شەمی ، شێت و ژیر ، شوانە ،خەزاڵ،یاری، یای ئەستی، زەڕدەشتی، زەمبیل فرۆش ، زستانە "وصەدان بەیتی‌تر .

جگە لەمانە گەلێ دیوانی هۆنراو و لە هۆنەرانی کوردەوە بە

یادگار بە جێ ماون کە زۆربەیان لە چاپ نەدراون و لەوانەیە بە هۆی تێپەڕینی ڕۆژگارەوە لە ناوچن و نیشانێکیان لێ بە جێ نەمێنێ . ئەو هۆنەرانە کە هۆنراوەکانیان بە یادگار ماونەتەوە بریتین لە : " ئەحمەدی خانی، حاجی قادری کۆیی ، مەولەوی ، وەفایی، جانی ، مەهجووری ، بێسارانی، یووسف یاسکە ، غەمناکی مەحزوونی، زەهاوی، خانای قوبادی، خەستە ، ڕەنجوور ، ئەحمەد پریسی ، کەیفی، فەریق ، زەنووری، داخی، هجری ،غەمبار ،خاکی، شەیدا ، صافی، دڵدار ، گۆران ،" و صەدان هۆنەری ترکە لاپەڕە کانی مێژووی وێژەی کوردی یان بە هۆنراوە تەڕو پاراوەکانیان ڕازاندووەتەوە .

## زاراوەکانی کوردی

زمانی کوردی کە یەکێکە لە لقە زمانە کۆنەکانی ئێرانی ، بە پێ ی بەڵگەکانی مێژوویی بە تایبەت بەڵگەی مێژوونووسان و خۆرهەڵاتناسان، زمانی کوردی پاشماوەی زمانی مادی یە ، وە لە درێژایی ڕۆژگاردا گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووەو بە هۆی گۆڕانی باری کۆمەڵایەتی و رامیاری و ئابووری مەڵبەندەکان و دەراوسێ یەتی و تێکەڵی لەگەڵ زمانەکانی تردا بە چەن زاراوە- یێکی ناوچەیی دابەش بووە .

لەبارەی زمانی کوردی یەوە کە ئەگەڕێتەوە سەرزمانی مادی، دارمستتر ئەڵێ : پەڕاوی " ئاوێستا " کە لە زمانی مادەکانا بۆزەڕدەشت هەناردراوە بە زمانی مادی نووسراوە، زمانی کوردیش پاشماوەی زمانی مادی یە . نۆلدکە ئەڵێ: ئەگەر بەردە نوسراوێ لە مادەکانەوە بکەوێتە دەست ، شک ئەڕوا وەکوو خەتو

زمانی بەردەنووسراوەکانی پارس، بێ چونکە ئیسترابۆن لە نووسراوەکەی دا وتوویە: خەڵکی مادو پارس لە زمانی یەکتر تێ ئەگەیشتن .

بە پێی بیرو بڕوای مینۆرسکی گەرچی لە زمانی مادی یەوە جگە لە چەند ناوی تایبەت شتێ تر بەجێ نەماوە، بەڵام بە پێی بەڵگەکانی مێژوویی ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە نەتەوەی کورد - پاشماوەی ترۆمی مادە، دیارە زمانەکەشیان لکێکە لە زمانی مادی کە پەڕاوی ئاوێستای پێ نووسراوە.

دوکتۆر سپایزر ئەڵێ : هۆزەکانی زاگرۆس واتە کوردەکانی دانیشتووی ئارارات بە ناوەکانی: " لۆلۆ، گووتی ، کاسی، سۆباری" هەر کام بە زاراوەیێکی تایبەت وت و وێژیان ئەکرد کە ئەم زاراوانە گەلێ بە یەک نزیک بوون.

میر شەرەفخانی بتلیسی کە پەڕاوی شەرەفنامەی لە ساڵی١٠٠٥ ی کۆچی دا نووسیوە ئەڵێ : زمانی کوردی داگری چوار زاراوەی - گەورەیە کە هەر کام لەم زاراوانە چەند لقی لێ جیا ئەبێتەوە و ئەو چوار زاراوانە بریتین لە: " کرمانجی ، لوڕی، کەلهوڕی، گۆرانی "

بەڵام زمانناسانی هاوچەرخی کورد، زمانی کوردی یان بە پێنج زاراوە دابەش کردووە کە ئەم پێنج زاراوە بریتی یە لە: " کرمانجی باکووری، کرمانجی باشووری، گۆرانی، لەکی،لوڕی" ، وە هەر کام لەم زاراوانە چەند لکیان لێ جیا ئەبێتەوە. - زاراوەکانی کوردی بەم چەشنەیە :

١ - **کرمانجی باکووری** : کە بریتی یە لە شێوەکانی"بۆتانی ، بادینانی ، بایەزیدی، شەمدینانی، زازایی، قووچانی "

ئەم مەڵبەندانە ئەگرێتە بەر : " ماکۆ ، ورمێ، خۆی، سەلماس ، هەوشار ، قووچان ، بجنوورد ، کەلات ، دەوگەز ،شیروان ، فاراب، روودبار ، دەماوەند" لە ئێران . بادینان ، دهۆک ، ئاکرێ ، بارزان لە عێراق . ئیرەوان و بەشێ لە ئەرمەنستانی رووسیەو قارس و دیاربەکرو وان و ئەرزرۆمو پتلیس و ئەخلات و سعرد لە تورکیەو بەشێک لە سووریەو لبنان.

٢ ـ کرمانجی باشووری : کە بریتی یە لەشێوەکانی"سۆرانی بابانی ، موکریانی ، ئەردەلانی" ئەم مەڵبەندانە ئەگرێتە بەر: سنە، مەریوان ، جوانرۆ، سەقز، بانە سابلاغ، سەردەشت ،بۆکان ، میاندواو ، شنۆ، هەوشار لە ئێران ، وە رەواندز، حەریر ،هەولێر، پژدەر، کەرکووک ، سلێمانی، پێنجوێن لە عێراق .

٣ ـ گۆرانی یا هەورامی: کە بریتیە لە شێوەکانی،"هەورامانی تەخت ، لهۆنی ، ژاوەرۆیی" ئەم مەڵبەندانە ئەگرێتەبەر: ژاوەرۆ، هەورامانی تەخت ، نەوسوود، پاوە لە ئێران . تەوێڵێ، بیارێ، ئێلان پێ لە عێراق، وە هەندێ لە هۆزەکانی گۆران وهەوشارو خانەقین و زەنگەنەو سیامەنسوور لە ئێران و عێراق دا بە شێوەیێک لە شێوەکانی زاراوەی گۆرانی ئەدون . ئەم زاراوە لە سەرەتای پەیدا بوونی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا زمانی هۆنراوو وێژەی هۆنەران و بوێژانی کورد بووەو گەلێ شوێنەواری بایەدار بەم زمانە بە یادگار ماوەتەوە.

شەمسی قەیسی رازی لە پەڕاوی " المعجم فی معاییر اشعار العجم " کە لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچی دا نووسیویە ئەڵێ : باشترین و خۆشترین کێشی هۆنراو فەهلەویاتە کەبەهەوا ـ کەی هەوای هەورامانی ئەڵێن و هەوای هەورامانی بریتی یە لە

هەوا و ئاهەنگی خەڵکی هەورامانی کوردستان، کە بە زاراوەی - هەورامی یا گۆرانی ئەدوێن.

بە پێی لێکۆڵینەوەی لێکۆڵەران ، زمانی مادی کە زمانی زگماکی و مێژوویی خەڵکی ئازەربایجان و کوردستان و وڵکەکانی ناوەندی ئێرانە، بە هۆی باری ناوچەیی و کۆمەڵایەتی یەوە چەند لقی لێ جیا بووەتەوەو لەگەڵ ئەوەش دا لەگەڵ زمانە کۆنەکانی ئێرانی دا هاوچەشن و نزیکە ، وە لەزۆربەی نووسراوی مێژوو- نووسانی ئیسلامی دا بەم زاراوانە فەهلەویات وتراوە، وەزمانی پەهلەوی کە گەلێ پەڕاوی پێ نووسراوە لکێکە لە زمانی کوردی.

لە شوێنەواری هۆنەران و بوێژانی رەی دا کە بە زاراوەی رازی یا لوڕی وت و وێژیان کردووە ، وادەرئەکەوێ کە زمانی مادی تاسنوورو کەوشەنی رەی رۆیشتووە. شاری هەمەدان وقەزوێن و ساوەو مەلایرو تویسرکان و هەندێ لە شارەکان و عێلەکانی ناوەندیو خۆرئاوایی ئێران و هەروەها شمێران و دەماوەندو دێکانی تارانیش بە یەکێ لە زاراوەکانی کوردی دوا ون .

ئیبنی خوردادبەو هەندێ لە جوغرافی زانانی ئیسلامی،وڵاتی پەهلەوی زوانانیان بە " بلادالپهلویون" ناوبردووە. ئەم ناوە تا چەند سەدەی پاش ئیسلام لە تەنیشتی ناوی " الجبال"یا کوێستان لەسەرچاوەکان دا ئەبینرێ . پاشان ئەم ناوە بە ناوی "هەورامان" ناوبانگی دەرکردو لەپاش ماوەیی تر بە شێوەی " هەورامانات" بە بەشێکی گچکە وتراوە .ئیبنی خوردادبە ناوی شارەکانی " بلاد الپهلویون"ی بەم چەشنە ناوبیر کردووە :" رەی، ئەسپەهان هەمەدان ، دەینەوەر، نەهاوەند، ماسیدان، مێهرجانقذف ، سوورە بەرد، شارەزوور."

٤ ـ لەکی : کە بریتی یە لە شێوەکانی" کەڵهوڕی ، ئیلامی، کوودەشتی ، شیروانی " ئەم مەڵبەندانە ئەگرێتەبەر : " کرماشان ، مایدەشت ، کولیایی، دەینەوەر ، قەسرشیرین،نەیریز لە ئێران ، خانەقین ، مەندەلی ، بەدرە، کووت لەعێراق .

٥ ـ لوڕی : کە بریتی یە لە شێوەکانی: " فەیلی،بەختیاری هەفتگلی ، سووسەنگردی" لە بنەڕەتا بە دوو شێوە دا بەش ئەکرێ. یەکەم شێوەی لوڕی بەختیاری کە مەڵبەندەکانی:دزفوول،شاری ـ کورد، چوارمەحاڵ ، پشتکۆ ناوچەکانی تری بەختیاری ئەگرێتەبەر دووهەم شێوەی لوڕی فەیلی کە لەم مەڵبەندانەدا وتوویژی پێ ئەکرێ : خوڕەماوا ، ئەلشتەر و ناوچەکانیان.

مامۆستا گیوی موکریانی لە فەرهەنگی مەهاباد ئەڵێ : کۆنترین پەڕتووکی کوردی ناوی ( دینکەرد )ەکەبەزمانی پەهلەوی نووسراوە و ئەو زمانە زمانی لوڕو کەڵهوڕو شوانانە .

مامۆستا مەردووخیش لای وایە کە زمانی پەهلەوی یەکێ لە شێوەکانی کوردی بووە کەگەلێ بەزاراوەی لوڕی وگۆرانی یەوە نزیکە .

## هۆنراوی کوردی

هۆنەرانی کۆنی کورد هەر لەمێژەوە بەکێشی نێوارهۆنراویان هۆنیوەتەوە ، دیارە هۆنراویش بەر لە داهاتنی کێش و نێوار ـ هۆنراوەتەوە . بە تایبەت هۆنراوو هەڵبەستی کوردیش هەر لە مێژەوە لە سەر ژمارەی پەنجە یاهیجا وتراوەو ئەم چەشنە هۆنراوە بەهۆنراوەی دەهیجایی ناسراوە . واتە هەر خشتێکی دە هیجای هەیە و ئەمەش هۆنراوێکی خۆماڵی یە .

بە پێی دیوانی هۆنەرانی کورد کە بە یادگار بۆمان ماوەتەوە، هۆنراوی کوردی ئەکرێ بە دوانزە بەشەوە کە بریتین لە: " دوو تاکی، هەڵبەسە، بەند، پارچە، فەرد، چوار خشتەکی، بەندی دوبارە، داچنراو، زیادکراو، چیل ، رازاوە، مەتەڵ".

دووتاکی یا "مثنوی":

بە هۆنراوێک ئەڵێن کە هەر بەیتێکی سەروایێکی تایبەتی هەبێ. ئەم چەشنە هۆنراوە زۆرتر لە چیرۆک و داستاندا بە کار ئەبرێ . وەکوو چیرۆکەکانی : " شەماڵ و زەلان، خەسرەوو شیرین، کەنیزەک و یازدەڕەزم، وەنەوش و بەڕەزا " کە لە سەر ئەم ڕێچکە ڕۆیشتون . ئەم چەشنە هۆنراوە لە لایەنی ئێرانیەکانەوە بەدی هاتووەو لە وێژەی کۆنی عەرەبدا نیشانەیی لەم چەشنە هۆنراوە نابینرێ . بۆ وێنە فەقێ عەبدلی بۆرەکەیی لە " شەماڵ و زەلان" دا ئەڵێ:

قاوکەردش وە قین وەکەیانەوە      هەی دادهەی بێداد هەی بەیانەوە
خێزان خرۆشان تەمام سەرداران      سەرداران صاحیب هەزار هەزاران
هەی داد هەی بێداد شێران شێرزاد      نا مووس مەردی زەلان شی وەباد
صەف دا صەف ئارا سەرهەنگ سەردارا ن      تیپ تیپ و لەک لەک نەسەردیارا ن
تیپێ کیانا پەی پەچەپانا      قەدیم هەوارگەی گەورەی جافانا
تیپێ کیانا پەی شار سنە      چەنی زەخیرەو بارخانەو بنە
تیپێ کیانا پەرێ کۆی ئەکز      سپەردش بە ئەو ئاشار سەقز
تیپێ هەمدان تیپێ کرماشان      تیپێ کیانا پەرێ هەورامان
تیپێ پەی سەردەشت تیپێ پەی بانە      تیپێ پەی سەڵماس تیپێ پەی خانە
تیپێ پەی ورمێ تیپێ پەی هەوشار      تیپێ پەی کرند تیپێ پەی بیجار
تیپێ پەی ڕێژاو تیپێ پەی زەهاو      تیپێ کیانا ئەو پەرێ دواو

تیپێ پەی ماردین تیپێ پەی قەجەر      تیپێ کوردسان شۆڕ شەڕ نە سەر

تیپێ پەی هندی تیپێ پەی کشمیر      تیپێ پەی بۆتان تیپێ پەی حەریر

تیپێ پەی بتلیس تیپێ پەی ئەخلات      تیپێ پەی قووچان تیپێ پەی کەلات

**هەڵبەسە یا " غزل ":**

بۆ دەربڕینی هەست و ناڵەو هاواری دەروونە. نیوە هۆنراوی یەکەمی سەرەتای هەڵبەسە کە لەگەڵ نیوەکەی تریا لە سەر یەک سەروان و هەموو هۆنراوەکانی تریش کە لە شوێنی ئەودا دێن لە سەر ئەو سەروایە ئەڕوا تا ئەبڕێتەوە. ئەو کێشانەی کە لە هەڵبەسەو بەندا بەکار ئەبرێ یەکسانن ، وە جیاوازی لە نێوانی هەڵبەسەو بەند ئەوەیە کە ژمارەی دێڕەکانی بەند لە هەڵبەسە زیاترە. هەڵبەسە بۆ دەربڕینی هەست و ناڵەی دەروون و ئەوین و خواناسیەو بەدەگمەن ژمارەی دێڕەکانی ئەگاتە دە یا دوانزە بەڵام بەند بۆ هەڵگوتن و گلەو گازندەو مەبەسی خووڕەوشت و پیتۆڵی و ئایینی یەو ژمارەی دێڕەکانتا هەر کاتێ هۆنەر سەروای بە دەستەوە بێ ئەتوانێ درێژەی پێ بدا.

لە ناو هۆنەرانی کوردا باوە کە هۆنەر ناو، وە یا نازناوی خۆی ئەخاتە دوایین دێڕی هۆنراوەکەی خۆیەوە ، وە ئەم رەوشتە لە ناو هۆنراوی فارسیش دا باوە. بەڵام ئەم رەوشتە لە بەندا باو نەبووە. ئەوەش ئەبێ بڵێین کە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیا کە ئایینی یارسان یا حەقە لە هەورامان دا پەرەی سەندووە ، سانسەهاکی بەرزنجەیی گەلێ هۆنەری لە دەوروبەری خۆی کۆکردووەتەوەو گەلێ شوێنەواری بایی داریان بە کوردی دانا وە. بۆ نموونە " عابدینی جاف " لە سەدەی هەشتەمی کۆچی دا - لەم هۆنراوانەدا نازناوی خۆی بەکار بردووە کە ئەڵێ :

بە وتەی سەرھەنجامم | لە شارەزووری ھەنجامم
یارم لەوێ ئەدا کامم | لە بادە پڕ ئەکا جامم
سا رێش ئەکا رێش و زامم | تا بگەمە ھەمێ و دامم
من عابدینی ھەورامم | دڵداری جوانی خواجامم

ھەڵبەسە کە لە کوردی دا چامەیشی پێ ئەوترێ، لە بنەڕەتا بە واتای ئەوین بازی یە، وە دیوانی زۆربەی ھۆنەرانی کورد داگری ئەم چەشنە ھۆنراوەیە. بۆوێنە ئەم ھەڵبەسەی "نالی" یە وێنەیێکە لە ھۆنراوی ھەڵبەسەی کوردی کە ئەڵێ:

کەتۆقیبلەی دەمەت سابێنەقوربان | لەسەرماچێ دڵم مەشکێنەقوربان
وەرە بنواڕەدوو دەستی خەناویت | خەتاوی چی ھەموو ھەرخوێنەقوربان
لە ئاوی چاوی من دا خۆت ببینە | لەباتی مەنظەرەو ئاوێنە قوربان
ئەگەردڵ غەیری حوببی تۆی تیا بێ | بە دەستی خۆت دڵم دەربێنەقوربان
لەبۆخەلقی خەڵات پەخشانی ماچە | خەڵاتی من ھەمووھەرجوێنەقوربان
فتووری چاوەکانت نانوێنێ | بە "نالی"فتنەبەس بنوێنەقوربان

بەند یا " قصیدە ":

وەکوو ھەڵبەسە نیوە ھۆنراوی یەکەمی سەرەتای بەند لەگەڵ نیوەی دووھەمیا لە سەر یەک سەروا یەو ھەمووی ھۆنراوی بەندەکە لەسەر ئەو سەروایە ئەڕوا. ژمارەی دێڕەکانی ئەبێ لە یازدە دێڕ کەمتر نەبێ. ھۆنەر ھەتا سەروای بە دەستەوەیە ئەتوانێت درێژە بداتە باسەکەی. ھۆنراوی بەند بۆ ھەڵگوتن، گازندە،بیرەوەری، پەند، شیوەن، پرسیارو وەڵام، مەبەستی کۆمەڵایەتی بەکارئەبرێ وێنەی ئەم چەشنە ھۆنراوانە لە وێژەی کوردی دا زۆرە.ئەم بەندەی (رەمزی) یە نمونەیێکە لە ھۆنراوی بەند کە ئەڵێ:

دەمێکە پەرتەخەیاڵم،بڵاوەئەفکارم | دەمێکەلاڵەزمانی دڵی پڕ ئازارم

دەمێکە باعثی پەستیمە عزەتی نەفسم
دەمێکە مانعی بەرزیمە بەختی بەدکارم
دەمێکە شەوقی لەئاسۆنەدا وەرۆژی ئومێد
دەمێکە سوبحی مەرامی نەدیوە شەوگارم
بە دەوری نوقتەیی ئاوەندی دائیرەی غەمدا
لەسەر صەحیفەیی ئەمدەورەچەشنی پەرگارم
بە شەوستارە ژمێریی ئەکەم هەتا وەکورۆژ
بە رۆژ هەتا وەکووشەو،پاسەوانی بازارم
بە دەردو داخەوە،کە تل ئەخۆمو بێ هۆشم
بە ئۆفو ئاخەوە، کە خول ئەخۆموهوشیارم
بەتیغی جەوروجەفا ،سینەئەنجن ئەنجن خۆم
بە تیری دەردوبەڵا،جەرگ ودڵ بریندارم
منی فەلەک زدەوو بێ نەوا ئەبێ چی بکەم
لەگەڵ زەمانەیی بەدکارو بەختی لاسارم
نەخاوەنی مەڕو ماڵات وجووت و ئەملاکم
نە صاحبی رەوگ و رانودێو زەوی و زارم
نە شێخی دەس بڕی،ئاینی دین بە دونیاوە
نەبیرو مورشدی بێ چاوو رووی ریاکارم
نە خاوەنی کەس وکارێکی دەوڵەمەندی بەچنگ
نە صاحبی کوڕو کاڵێکی زۆرو دەس دارم
نە شارەزا بە بەلات و نە هەمدەمی سوفەرا
نە یاوەری وزراوو ئەمیرو خونکارم
نە کاتبێکی دەنی،خودپەسەندی نەفام
نە شاعیرێکی هەوا بەرزی هەرزە گوفتارم
من ئەوکەمەم کە لە فەضڵی خواوە تا ئێستە
بەدیم نەکردووە دەرحەق بەیاروئەغیارم
گوڵی شکۆفەیی باخی کەسێکی پاک نەژاد،
نەمامی گوڵشەنی زاتێکی راست رەفتارم
لەگەڵ ئەمیشە ئەزانم کە (رەمزی)من هەرگیز
لە لەومی ناحەزی پەتیارەنەبووە رزگارم

پارچە یا "قطعە":

بە هۆنراوێ ئەڵێن کە ژمارەی دێڕەکانی لە نێوانی دوو تا هەژدە دێڕە. هۆنراوی پارچە بۆ پەندو خووورەوشت ئەوترێ. — پەندەکانی پیرەمێردی نەمر هەمووی پارچەیە. ئەم هۆنراوانەی پیرەمێردە نموونەیێکە لە هۆنراوی پارچە کە ئەڵێ:

دە پەندەو، یەکێ دەدینا ردێنێ — دیاری ژیانە، خەڵکی بێخوێنێ
لەگەڵ خوادا سەرڕاست بە چاکە — هیچ لەو ون نابێ خراپەو چاکە
لەگەڵ خەڵک دا ئینصاف بنوێنە — هەتا دەتوانی نەفست بشکێنە
بۆ هەژار دڵسۆز، بۆگەورە حورمەت — بۆ لەخۆت خوارتر لوطف و شەفەقەت
بۆ دۆست رابەربە، بۆ دوژمن بەحێلم — بە تەوازع بە لەگەڵ ئەهلی عیلم
لەگەڵ جاهیلدا بێ دەنگ و خامۆش — ئەم دە پەندەی من نەکەی فەرامۆش
کلیلی گەنجی پەند دیانەتە — دین نەبێ پەندت لە لا زەحمەتە

فەرد یا هۆنراوی یەک تاکی:

بە هۆنراوێک ئەڵێن کە هۆنەر مەبەستێک لە ناو تاکە هۆنراوێک دا ئەگونجێنێ و ئەم چەشنە هۆنراوە لە کوردی دا زۆرەو لە دیوانی زۆربەی هۆنەرانی کوردا ئەبینرێ. فەرد داگری دوو خشت یا دوو دێڕ هۆنراوە. بۆ نموونە بڕوانن ئەم فەردەی مەولەوی کە ئەڵێ:

ئای چەند سەرچەنگ چەرخ چەپ وەردم
چەرخ چەن چەرخا و من مام نەمەردم

واتە: ئای چەند چەپۆکی چەرخی چەپگەردم خواردو، چەند چار چەرخ هەڵسووڕا کە چی من هەر مامەوە بۆ مەینەتی دنیا و نەمردم.

وەیا وەکوو "صابری" ئەڵێ:

جا وەکەت کوێرو زبانت لاڵ و غافڵ کەڕە گوێت
وەقتی ئیحسان و عیبادەت چونکەشەیتان فێرە پێت

وە یا " ئەمین فەیضی بەگ " ئەڵێ:

گەر رەفێقت پیاوی صادق بێ چ باکی رێگەتە
گەر کەسێ بەخوو لەگەڵتا بێ جەهەننەم چێگەتە

چوارخشتەکی یا " رباعی ":

چوارخشتەکی بریتی یە لە چوارخشت هۆنراو یا چوار نیوە هۆنراو . لە هۆنراوی چوارخشتەکی دا تەنیا دێڕی دووهەمی واتا خشتەکی سێهەمی سەرواکەی ئازادەو ئەو خشتەکیەکانی تری هەموو یان یەک سەروایان هەیە . وەکوو چوارخشتەکیەکانی بابەتاهیرو خەلیفەئەڵماسی گەزەردەرەیی و مامۆستا هەژار . لە وێژەی فارسی دا چوارخشتەکیەکانی خەیام ناوبانگی جیهانی پەیدا کردووەو — گەلێ لە هۆنەرانی جیهان ، چوارخشتەکیەکانی خەیامیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی خۆیان . گەلێ لە هۆنەرانی کوردیش چارینەکانی خەیامیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی . ئەم چارینانەی " مامۆستا هەژار " نموونەیێکە لە گۆڕینی هۆنراوی خەیام کە ئەڵێ:

ئەم گۆزەوەکومن بووە :دڵدا روهەژار
جارێکی دڵی خۆش بووە صەدجار خەمبار
ئەو هەنگڵ و دەسگرەی لە ملیا دیوتە :
دەستێ بووە زۆر خراوەتە سەرملی یار

* * *

مەڕوانە پەشێو لێو بەبارم .نە کەمم
بەرزم لە هەزاری یا چیای سەرپەتەمم
هەر کەس لە سەرێکەوە خودا پێداوە
من خاوەنی شەشدانگی کوڵ و دەردوخەمم

**بەندی دوبارە یا "تەرجیعبەند":**

ئەم چەشنە هۆنراوە کە کۆمەڵە هۆنراوێکی بەند بەندە، رەنگە هەموو چەشنە هۆنراوێکی وەکوو پێنج خشتەکی وشەش خشتەکی و حەوت خشتەکی و داچنراوو زیادکراوی بەرکەوێ . لەم چەشنە هۆنراوەدا لە دوایی هەر بەندێکا هۆنراوێک ئەوترێتەوەو هەر بەندێک لەم هۆنراوە لەسەر سەروایێک ئەڕوا . بۆنموونەبەندێک لە بەندی دوبارەکەی " مەلای جزیری" دێنین . ئەم بەندی دوبارە کە بریتی یە لە حەوت بەند، لە ناوەندی هەر بەندێکا ئەم تاقە هۆنراوە دووپات ئەکرێتەوە کە ئەڵێ :

مەستو خرامان بساز لێ دمەشن سیی و قاز

ئەمەش بەندی یەکەمی " بەندی دوبارەکەی" مەلای جزیری یە کە ئەڵێ :

چۆمە تەماشا چەمەن تازەگول و نەستەرەن
غونچەو بشکۆ لە کن چیچەک و نەسرین سمەن
تێک سەحەرێ مەست بوون موحبەتەکێ خوەست بوون
زولفەکێ ئەو بەست بوون عەقرەبیان گەست بوون
یەک بیەک ئەو خەملین بەغچە بوان کەملین
بولبولێ سوهتی دلین تێک ژوان دەس بلین
دل بمەیی بیتەساز رەوضەیێ باغی مەجاز
مەستو خرامان بساز لی دمەشن سیی و قاز

**داچنراو یا " مسمط" :**

بە چەشنە هونراوی ئەلین کە داگری شەش دیر بی، وە دوو ـ نیوە هونراوی دوایی سەروایێکی بی . گەلی لە هونەرانی کورد هونراوی داچنراویان لەپینج دیردا هونیوەتەوەو ئەم چەشنە

هۆنراوە کە لە وێژەی کوردی دا پێنج خشتەکیشی پێ ئەوترێ نموونەیان زۆرە. لەم چەشنە هۆنراوەدا پێنج خشتەکی یەکەم هەمووی دێڕەکانی یەک سەروای هەیەو ئەو پێنج خشتەکیەکانیتر کە بە شوێن ئەودا دێن جگە لە دێڕی پێنجەمیان کە سەروای - پێنج خشتەکی یەکەمی هەیە ئەوانیتری سەروایێتریان هەیە. ئەم چەشنە هۆنراوە لە دیوانی "ئەحمەدی کۆر" دا زۆرە و ئەتوانین بڵێین زۆربەی هۆنراوەکانی ئەو پێنج خشتەکیە. ئەم پێنج خشتەکی یەی " وەفایی" نمونەیێکە لە هۆنراوی داچنراو کە ئەڵێ :

فەرموویە کە من پادشەهی حوسنی دڵارام
خورشیدو مەهن ئاوێنەداری روخی زیبام
فردەوسی جەماڵم بە نهالی قەدی طوبام
یەعنی بە دوو لێوصاحبی اعجازیمەسیحام
ماچێکی دەمتکافی یە بۆ کوشتەیی باڵام
فینجانی دەمتساغری یاقووتی رەوانە
وەک نەشئەی حەیاتی دڵە یاقووتی رەوانە
ئەو چاوە طەبیبو بەلەدی دەردی دڵانە
عادەتچیە بۆمن کەحەکیمێکی نەزانە
جێی نەشتەری وی ئاگری بەردا دڵی سووتاوم
ئەگریجەو پەرچەم مددی پەرچەمی کاڵن
فوجی حەبەشن لەشکری سلطانی جماڵن
دەروێشی روو رەونەقی باخی خەتوخاڵن
هەریێکە لە لایێ بە ئومێدی سەرو ماڵن
چون کەوتمە ئەو داوە بە خۆمو دڵی شەیدام
ئەی موشکی خەتایی خەتِوخەت جەوهەری کوڵمەت
ئەی سونبولی تەردووکەلیسەرمەجمەری کو لمەت
سووتاوە (وەفایی)لە هەوای ئاوری کوڵمەت
سا ئەودەمەوا بێنە ئەتۆبیو سەری کوڵمەت
غەیری ئەو بە خوانیە لەو لێوە تەمەننام

زیادکراو یا "مستزاد":

ئەم چەشنە هۆنراوە رەنگە لە چوارخشتەکی و هەڵبەستەو چامەو بەندىدا هەبێ، وە ئەمەش بە چەشنێکە کە لەپاش هەر خشتێک تیکەیێکی کورتی پێ زیادبکرێ، وە ئەم تیکە کورتانە لەگەڵ یەکا هاوکێش و هاوسەروان و پەیوەندیان بە یەکەوە هەیە. ئەم چەند هۆنراوانەی نالی‌یە نموونەیێکن لە هۆنراوی زیادکراوی کوردی کە ئەڵێ:

ئەی تازە جەوان ،پیرم وئیفتادەو کەوتووم تا ماوە حەیاتم
دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کەلە دەس چووم قوربانی وەفاتم
تۆ یووسفی ئەو حوسنی لەسەر میصری جنانی من پیرمو فانی
لەم کولبەی ئەحزانە نە زیندوومو نەمردوم هەر وا بە تەماتم
فەرقێکی نەکرد نەفسی نەفیسم بە عینایەت وەحشی لە ولایەت
لەم گۆشەی وێرانەیە هەر مامەوە وەک بووم وەی شوومی وڵاتم
ئەی قوببەی "طیبە"کە دەڵێ حوققەی "طیبی" مەئوای حەبیبی
مسکینم و بەو خاکە عەطرناکەوە هاتووم بەو بۆنەوە هاتم

چیل یا "ملمع":

بە هۆنراویک ئەڵێن کە خشتێکی بە زمانی فارسی یا عەرەبی بێ و ئەو خشتەکەی تری بە کوردی بێ. وەکوو ئەم هەڵبەستەی "سالم" کە خشتێکی بە کوردی یەو خشتێکی تری بە فارسی یەوە ئەڵێ:

ئەگەر ئومێدی دڵ بێنێتە جێ ماهی جیهان ئارا
بەخال هندوش بخشم سمرقندوبخارا را
لەبن خاری موغەیلان وەصڵ ئەگەر بێ ئارەزوو ناکەم
کنار آب رکنا باد وگلگشت مصلارا

نەصیحەت بگرە گوێ جانا ، لە لایان زۆر بە تەعظیمە

جوانان سعادتمند ، پند پیردانا را

دوو سەد جار گەر بەگوێ‌خۆم حەرفی ساردت بشنەوم شادم

جواب تلخ میزیبدلب لعل شکرخا را

ئەگەر حۆری لە کوثرشوستوشۆی خۆی دا بە تۆ نابێ

بەآب ورنگ وخال وخط چەحاجت روی زیبا را

لە ئیدراکی شکەنجی عوقدەیی زوڵفت ئەرێشانم

کەکس نگشودونگشاید بەحکمت این معمارا

کە شۆڵەی طەلعەتی یووسف طلووعی کرد لە چی زانیم؟

کەعشق از پردە عصمت برون آرد زلیخا را

کەلامت "حافظا " دڵ سەنجە بۆ " سالم" وەها چاکە

کەبر نظم‌تو افشاند فلک عقد ثریا را

## رازاوە یا " موشبح"

ئەم چەشنە هۆنراوە گەرچی لە وێژەی کوردی دا وێنەی کەمە بەڵام لەبەر ئەوەی هەندێ لە هۆنەرانی کورد لەم چەشنە هۆنراوە یان هۆنیوەتەوە ، ناچارین کورتە باسێکی لێوە بکەین .ئەم چەشنە هۆنراوە لە بنەڕەتا ئەندەلوسی یەکان دایان ناوە . هۆنەر لەسەر دووهەمین دێڕی هۆنراوەکەی خۆی دا چەن پیتێک دائەنێ و ئەگەر ئەو پیتانە کۆبکرێنەوە ناو یا وشەیێکی لێ دروست ئەبێ. بۆ نموونە چەند هۆنراوی " مەحوی" دێنین کە ئەڵێ :

نیمە یاری نیگاهی ( غ،م،ز،ە )

غەمزە دل دۆزە لەتم کە،تۆبە (ش ،ی ر )

شیری ئەبرۆت یەک ئیشارەی بۆمنی شەیدا بەسە

تیژە چونکە داویە کوورەموحەببەت (ئا ،ب)

ئا بی تێغت دیاره ئاوی زیندەگانی تێکەڵە

کوشتەکانت زیندوون تا رۆژی (ح،ش،ر)

حەشرە هەستاوە لە عالەم قاپی تەوبە داخرا

غولغولەی عەلەم کەگەییەئەوچی(چ، ر،خ)

چەرخی کەچ رەفتارە باقڵ دەورەییێکی تر ئەدا

پڕزەهر کە جامەکەم وەک (ش ،ر،ب ، ت)

شەربەتی مەرگی لە ئاوی زیندەگی پێ خۆشترە

وەعدەی وەصڵی نەدەیتێ (ح، م، د ، ی)

" حەمدی" تا کەی بناڵێنێ لەژێر باری غەما

بۆچی نابێ ئەی صەنەم رەحمەت بەویشا جاریبێ.

مەتەڵ یا " معما " :

بە هۆنراوێک ئەوترێ کە هۆنەر ناوی دڵدار یا چتێ تر لە هۆنراوەکەیا بە شێوەی مەتەڵ دێنێ و لە سەری ئەڕوا ، وە ئەم چەشنە هۆنراوە هەم لە فولکلۆر وهەم لە وێژەی کوردی دا نموونەی زۆرە . بۆ وێنە لە فلکلۆردا ئەم چەند هۆنراوە کە مەتەڵیان تیایەو بە هیجا هۆنراوەتەوە دێنین . وەکوو :

قەڵای گەچین رێی نیەتێ ی چین . ( هێلکەیە ).

چل ناڵ چل بزمار چل چلووکەی چل هەزار . ( پشتەسەرە )

ئەم لا پەرژین ئەو لا پەرژین تیایەتی کۆترێکی نەخشین. (چاوە)

لەوێژەی کوردیشا هەروەها وتمان ئەم چەشنە هۆنراوەنموونەی زۆرە . بۆ نموونە چەند هۆنراوی ( مەسووری گەڵباخی)دێنین کە رووی کردووەتە ( شاکەی گەڵاڵی) و داوای لێکردووە کە ئەم مەتەڵە هەڵێنێ ، وە لەم هۆنراوانەدا مەبەستی ( ساڵ و چوار وەرزە ) ، کە ئەڵێ :

شاکە طەیرێ وەن،براکەطەیرێ وەن

نە ئی دنیادا عەجەب طەیرێ وەن

چوار بالْ دارۆ هەر بالْ خەیری وەن

چوار سەر دارۆ هەرسەرسەیرێ وەن

هەر بالْێ سێ پەڕ بەنەن وە بالْش

هەر پەڕێ سێ ڕەنگ مەنمانۆ کالْش

## شیخ شهاب الدینی سوورەبەردی

(٥٣٩ – ٦٣٢)

مەی نۆشی بەرزی شاری سوورەبەرد — ئارایشدەری دەشت و کەژو هەرد

پێغەمبەرێکی زانستی دێرین — بۆ دانەوەی باس (فخرالمرسلین)

شەیدا بە تیشکی پاکی خودایی — مێملی مرگ و درۆو جودایی

شۆڕە سوواری بەرزی خواناسی — کەخوای بە تاق و تەنیایی ناسی

خەرقە،پۆشێکی مەیخانەی ئەوین — ژیانی پڕ لە هەورازو نەوین

دلی روون بووە بە رووناکی خوا — وتەی بۆ دەردی دل بووە دەوا

هۆنراوی دلی هێنایە خرۆش — بیرەکەی خەلکی هێنایە سەرهۆش

هۆنراوەکانی خۆراکی گیانە — وتاری مایەی ئەهوەنی ژیانە

هاوڕازی داستانی ئەم شوێنە ناوی " شیخ شهابالدین " کوڕی " عبداللە " و نازناوی " شەهاب "ە کە لە سالی ٥٣٩ ی کۆچی لە شارۆلکەی سوورەبەرد یا سوهر وەردا هاتووەتەدونیاوە. سوورە بەرد یا سوهروەرد شارۆلکەیێ بووە لە گەڕووس کە بە پێی وتەی ئیبنی خورداذبە ئەم شارۆلکە لە سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچی دا یەکێ لە شارۆلکەکانی شارەزوور بووەو شارەزووریش یەکێ لە شارەکانی " بلادالپهلویون" هاتووەتە ژمار. سوورەبەرد بە پێ ی

وتەی مێژوونووسان لە پەلاماری مەغووڵەکان دا وێران کراوە و- زۆربەی خەڵکەکەی کوژراوە، بەڵام ئێستا بە یەکێ لە دێکانی گەرووس دێتە ئەژمار کە لە نزیکی شاری زەنگان دا یەو زۆربەی دانیشتوانی کوردن.

بە پێی پەڕاوی " دايرة المعارف الاسلامية "، شێخ شهاب- الدین هەر لە سەردەمی مناڵی لە قوتابخانەدا خەریکی خوێندن بووەو پاشان چووەتە بەغداو لە لای مامی " ابونجیب " خەریکی خوێندنی فقهی ئیسلامی بووەو پاش ئەوە رۆیشتووەتە لای " شێخ عبدالقادری گەیلانی" و لە زانست و خواناسی ئەو بەهرەی وەر- گرتووەو ماوەیێکیش لە لای " شێخ نجمالدینی کبری" دا ماوەتەوە و لە زانست و خواناسی ئەو بەهرەمەند بووە، بەڵام شێخ کاتێ لە لای مامی بووە کە وتووەتە داوی تەریقەتەوەو هەر لە ئەو تەر- یقەتی وەرگرتووە، لەپاشا لە بەغدا ماوەتەوەو خەلیفەی بەغدا کە لەو سەردەمەدا ناوی " ناصرالدین" بووە گەلێ رێزی گرتووەو بۆ بەرێوە بردنی وڵات پرسی پێ کردووە.

شێخ بە جۆرێ ناوو ناوبانگی خواناسی دەرکردووە کە مو- سڵمانان لە هەموو شوێنێکەوە هاتوونەتە لای و دیتنیان لێ کردووەو لە پەندو ئامۆژگاریەکانی بەهرەمەند بوون. شێخ لە ئاخرو ئۆخری تەمەنیا تووشی نەخۆشی لەرزۆک یا ئیفلیج بووەولە گەڵ ئەوەی سامان و دارایێکی زۆری هەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی - هەمووی سامانەکەی بە هەژارو فەقیربەخشی بوو کاتێ مردئەوە- ندەی نەبووە بەشی دووگەزە جاوی کفنەکەی بکا . شێخ لەساڵی ٦٣٢ لە تەمەنی ٩٣ ساڵی لە بەغدا دا کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی " دارالسلام" دا نێژراوە.

شیخ شهاب الدینی سووره‌بەردی یەکێ لە هۆزانانی هەرە - بەرزی سەدەی شەشەم و حەوتەمی کورد دێتە ئەژمار، وە یەکێ لە ئەستێرە هەرە گەشەکانی ئاسمانی کوردەواری یەو هەتا هەتایە هەر ئەدرەوشێتەوە. ئەو وەکوو ئەستێرەیێکی گەش ، ئاسمانی فەرهەنگ و زانستی ئیسلامی بە تیشکی خۆی تروووسکەدارکرد ،گەرچی ئەستێرەی ژیانی ئەو ئاوا بوو، بەڵام تیشکێ کە لە خۆیەوە بە جێی هێشت تائەمڕۆ هەر ئەدرەوشێتەوە. ئەو لەگەڵ ئەوەی لە شاری بەغدا لە ناو عەرەبان دا ژیانی بردە سەر، بەڵام هەرگیز کوردستانی لە بیر نەبردەوەو گاگا هۆنراوی بەزمانی کوردی - ئەهۆنیەوە.

شێخ گەلێ پەڕاوی بە زمانی عەرەبی نووسیوە کە گرنگترینی ئەو پەڕاوانە بریتین لە : ( عوارف المعارف ، رشف النصایح ، اعلام الهدی و ....." ه ئەو گەلێ شاگردیشی بارهێناوەو ودمو - ئیجازەی زانستی پێ یان داوە، کە لە ناوی ئەوانەدا ئەتوانین لە : " بهاء الدین زکریا ، سەعدی شیرازی" و هەندێ تر ناو ببەین. ئەو دامەزرێنەری تەریقەتی " سوهروەردی"یە. شێخ سەعدیشیرازیش یەکێ لە شاگردان و پەیڕەوانی ئەو بووەو لە پەڕاوی "بووستان" دا بەم چەشنە لەشێخ شەهابەوە یاد ئەکاو ئەڵێ :

مرا شیخ دانای مرشدشهاب دو اندرز فرمود بررویآب
یکی آنکه درنفس خودبین مباش دگرآنکه درجمع بدبین مباش

واتە: شێخ شەهاب ، زاناو مەلەوانی بیرتیژی لە گەڕانی دەریادا دوو پەندی دادامو ئامۆژگاریمی کردو پێمی وت : یەکەم لە فیزو هەواو خۆپەسەندی خۆت بپارێزەو دووهەم لە خەڵک بەدبین مەبەو بە چاوی خراپ سەرنجیان مەدە.

شێخ گەلێ هۆنراوی بەکوردی و فارسی و عەرەبی هۆنیوەتەوە کە هۆنراوە فارسی و عەرەبی یەکانی لەپەڕاوە عەرەبی یەکاندا هاتووە ، بەڵام هۆنراوە کوردی یەکانی لە ناو بەیازو کەشکۆڵە ـ کاندا تۆمار کراوە و بە یادگارماونەتەوە . ئەم هۆنراوانە نموونەیێکن لە هۆنراوە تەڕو پاراوەکانی ئەو کە ئەڵێ :

زامانم ئیمشەو ،زامانم ئیمشەو    های های ناسۆرەن زامانم ئیمشەو
گوڵگوونەن بەزووخ دامانم ئیمشەو    جەلاد نمەدۆ ئامانم ئیمشەو
ئەسرینم جەچەرخ زامانەن ئیمشەو    ئامانەن دامان غەمانەن ئیمشەو
عاڵەم جەناڵەم بێزارەن ئیمشەو    خرۆس کەی چون من بێدارەن ئیمشەو
طەبیب کۆن بدۆ دەرمانم ئیمشەو    بە دەرد ئەیووب کرمانم ئیمشەو
ئاخ ئاخم جەدەست برینەن ئیمشەو    مورغ شەوچەنیم گرینەن ئیمشەو
گەرمەن بازاڕم چەنی دەرد ئیمشەو    سوود سەودا مەن ئاهـ سەرد ئیمشەو
زوخاوان چەزام گاز مار ئیمشەو    بەرگم کەردەن چیت قەڵەمکار ئیمشەو
جەلادم جە لام بەرنشتەن ئیمشەو    چەنگ گیان کێشان نەمشتەن ئیمشەو
ئامان جە کێشان هیجرانم ئیمشەو    چون یووسف نەچای کەنعانم ئیمشەو
شام راحەتم زەحمەتەن ئیمشەو    ئێش رێش نێش نەسرەفتەن ئیمشەو
پڕ سامەن عاڵەم چەتاڵەم ئیمشەو    جەناڵەم مەشۆ ، من زاڵەم ئیمشەو
هاوارم جە عەرش ویاران ئیمشەو    جەدوودم گومبی ستاران ئیمشەو
بەدەرد فەرهادسەنگ تاشام ئیمشەو    شاپوور بیم تەصویر دۆست کێشام ئیمشەو
وامق بیم پەرسا مرای نۆشاد ئیمشەو    پەی عەزرا عومرم داوە باد ئیمشەو
هەی یاران بڕیان حەیاتم ئیمشەو    چون خضر خەریک ظوڵماتم ئیمشەو
ها بیموەسەر مەشق کولێەی نام ئیمشەو    چون بێژەن نەقەعر چای سیام ئیمشەو
هاوارم هاوار هاوارەن ئیمشەو    نە یارنە یاوەر دیارەن ئیمشەو
زام ناسۆرم پڕ نێشەن ئیمشەو    دیدەی بێ نوورم پڕ ئێشەن ئیمشەو

کونوارث کۆن خەلق کمران شین ئیمشەو    کۆن مەلا کۆن شێخ کۆن یاسین ئیمشەو
واوەیلا بە من دەیجوورەن ئیمشەو    دیدەم مەحو نوورکۆی طوورەن ئیمشەو
جان کەندەن مەدۆ عەذابم ئیمشەو    شەهابم بە بەرق کەبابم ئیمشەو
صەدای غوڕغوڕم چون صوورەن ئیمشەو    (قابض الارواح) ضەروورەن ئیمشەو
کێ زانۆ بە دەردنەبەردم ئیمشەو    جوانا وکەردەن رەنگ زەردم ئیمشەو
یاران هەی یاران بەدتالەم ئیمشەو    عالەم نەسرەفتەن جە نالەم ئیمشەو
من کەلەی بێ مەغز پووچمەن ئیمشەو    یاران (بەهممەت) کووچمەن ئیمشەو
من سیاسفتەی بێ بەرقم ئیمشەو    عەقرەب نێشش دان بەفەرقم ئیمشەو
جە دەست دەوران دادەدادەن ئیمشەو    دەروونم کوورەی حەددادەن ئیمشەو
نەحس شووم ئامەد ستارەم ئیمشەو    بە تێغ مریخ تەن پارەم ئیمشەو
بێ کەسم یا حەق تۆنی کەس ئیمشەو    فەریادرەس تۆنی فریامرەس ئیمشەو
دەشت مەحشەرەن من زێدم ئیمشەو    بە (لاتَقنُطوا) ن ئومێدم ئیمشەو
(شەهاب) ئارەزووی قورئانەن ئیمشەو    ئومێدش بە لوطف غفرانەن ئیمشەو

واتە : ئەمشەو برینەکانم هاتەوە ژان و دیسانەوە فرمێسکم داوەران و ئەوەندە گریام و نالەم کرد کە خەڵک لێم بێزارن . ئەوا من بە دەردی ئەیووب دوچار بووم و نازانم بژیشک لەکوێیە کە دەردەکەم دەرمان بکا . وەکوو یووسف و فەرهادو وامق گیرۆدەی داوی ئەوینم و لە یارەکەم دوور کەوتوومەتەوەو پشتم کۆماوەتەوە ، کە چی فرێشتەی گیان کێشەریش ئازارم ئەدا و گیانم ناکێشێ و ئەوا بێ کەس و بێوەر دانیشتووم و دیارە بەختم رەشەو ئە بێ بەم بەدبەختی یەوە بۆ خۆم بتلێمەوە . خوایا هەر تۆ بە فریای بەندەکانی خۆت ئەگەی، دەسا بە فریام کەوەو لە بەزەیی خۆت بێ بەشم مەکەو بە هیوای ئەوەم کە بمبەخشی و لە گونام ببووری .

# مەلا ئەحمەدی عارف

( ١٢٠٦- ١٢٦٣)

ئەستێرەیێکی گەشی بێ وێنە — هەڵبەستەکانی زۆر دڵ گەشێنە
قەلەندەرێکی رەندو بادەنۆش — بەهۆیمەی نۆشی بووەخەرقەپۆش
زانایی بەرزو سووتاوێکی پیر — مافپەرستێکی توانا و هەژیر
زمانخۆشێکی بەسۆزو ئەوا! — نەوای بۆ زامی دڵ بووە دەوا
گەوهەرناسێکی سەدەی هەژدەهەم — بووە پەروانەو سووتا بەگڕشەم
بەو سووتاوی یە چووەمەیخانە — بووە شاگردی بەزمی ئەو یانە
لەگەڵ مەیگێڕدا بووەمەیفرۆش — تا وتاویش بەسۆزبادەی ئەکردنۆش
هەتا باوەڕی هاتە سەر ئەوە — کە ژینی گێتی بەوێنەی خەوە
ئەمانە هەموو بیر ئەو پیرەیە — نموونەی فەردی ئەو هەژیرەیە

ئەستێرەی پرشنگداری ئاسمانی کوردەواری ئەم باسەمان ناوی ( ئەحمەد ) کوڕی مەلا سەعیدو نازناوی ( عارف)ە . بە پێی لێکۆڵینەوەیێکی زۆر کە بۆمان دەر کەوتووە ئەم هۆنەرەلەساڵی ١٢٠٦ی کۆچی لە یەکێ دێکانی هەوشاردا هاتووەتە دنیاوە و لە ساڵی ١٢٦٣ لە تەمەنی ٥٧ ساڵی دا کۆچی دوایی کردووەولەداوێنی گڵکۆی شێخ عوبەید وڵڵای نەهری لە شاری مەکە دا نێژراوە .(عارف) لە بەر ئەوە لە بنەماڵەیێکی خوێندەوار بووە ، هەر لە هەوشار لە حوجرەی فەقێیان دا خەریکی خوێندن بووەو پاشان بۆ خوێندن هەموو شوێنەکانی کوردستان گەڕاوەو پاش تەواو کردنی خوێندن گەڕاوەتەوە هەوشارو لە یەکێ لە دێکانی دا دامەزراوەوپاشماوەی ژیانی بە وانە وتن و هۆنراو هۆنینەوە بردووەتە سەر تا لە جیهان ماڵ ئاوایی خواستووە .

